# خواناساندا

«٢»

# لە دادگای ئیسلامدا

حبیب محمد سعید

چاپخانەی ( الارشاد ) لە بەغدا
ساڵی ١٤٠٦ی کۆچیی

# لەگەڵ خوانانساندا

زنجیرە وانەیەکە لـە قوتابخانەی ئیسلامدا کـە مامۆستایانی خواناسیی پێشکەشی ئەکەن تـا موسڵمانەکان بـە شێوەیەکی کرداریی لـە بانـگی خواپـەرستیی تێ بگەن ،وە هەڵەشەیی ئەم و ئەو کاریان لێ تێك نەدا و بە بیروهەستی کاڵ و کرچ بانگی خوا تێکەڵ بە بیروهەستی نـەفامیی نـەبێت و راستـەشـەقام بگیرێتە بـەر بەرەو رەزامـەندیی پـەروەردگار بە هیـوای هیدایـەتدانی مرۆڤایەتییەوە ..

# پێشەکیی

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد المرسلين وامام المتقين محمد وعلى آله وصحبه اجمعين ..**

ئەوەی راستیی بێ ، داد و یەکسانیی بەهایەکـە لـە بەها گەورەکانی ئیسلام .. چونکە مەبەستی ئیسلام حەسانەوەی ئادەمیزادە لـە هەردوو ژیاندا ، خۆ دیارە ئەگەر راستیی و داد لـە سەر زەویدا جێ گیر بن ئەوا **ئیسراحەت و هێمنیی و ئاسایش پەرە ئەستێنێ و پەیوەندیی نێوان ئەندامانی کۆمەڵ بەتین و بەهێز ئەبێت ، وە متمانەی نێوان میللەت و کاربەدەستان زیاتر ئەبێت،لە هەمان کاتا خێر** و بێر و هەرزانیی باڵ ئەکێشن بـە سەر وڵاتا و هەموو کەسێ بە دڵی حەساوەوە بـە کاری خۆی هەڵ ئەسێ و بەرەو پێش کەوتن هەنگاو هەڵ ئەگرێ ..

هەموو ئادەمیزادێـك ـ جگە لـە دەستەیـەکی

چەپەڵی خوێنمژ ، کە لـە چاو ژمارەی ئادەمیزادا زۆر کەمن ـ هەست بەوە ئەکات کە بـە بێ راسـتیی و داد ژیـان دانامەزرێ •• وە هەموو کەسێکیش بە تواناى خۆی ، لـە روانگەی بیرکردنەوەی خۆیەوە ، هـەوڵ ئـەدا •• بەڵام ئەوەی راستیی بـێ ، بـە درێـژایـی مێژوو ، مەگـەر تـەنهـا پێغـەمبـەران و هـەڵگرانی بیروباوەڕەکەیان ، توانیێتیان داد و یەکسایی لە ژیانی ئادەمیزادا بێننە دیی ••

ئـەوەتـا ئـایینی پاکی خـوا دادگای راسـتیی و یەکسانییشی بڕیار داوە و فـەرمـانی داوە بـە سـەر پێغەمبـەران و هـەڵگرانی رێبـازەکـەیاندا بـە داد و یەکسانیی گرێ و ناکۆکیی ئادەمییـەکان چارەســەر بکـەن ••

وە پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلى الله علیـە وسلم ـ لـە بارەی ئەو کەسانەوە کە کاروباری «قضاء» ئەگرنـە دەست فەرموودەی زۆری هەن • ئەوەتـا دەری

ئەخا هەر کەسێ هەوڵ بدا ببێتــە قازیی موسڵمانان بــەو مەرجەی داد و راستیی زاڵ بــێ بــە ســەر جــەور و ستەمیا ئەوا ئەچێتــە بەهەشــت ، خۆ ئــەگەر ســتەم و جەوری زاڵ بێ بە سەر داد و راستییدا ئەوا ئەخرێتــە ئاگری دۆزەخەوە ، کە ئەفەرموێ :

**« من طلب قضاء المسلمین حتی یناله ثم غلب عدله جوره فله الجنة ، ومن غلب جوره عدله فله النار » رواه ابو داود ..**

وە خوای گەورە وا لەگــەڵ قازییدا و دەســتی یارمەتیی بۆ درێژ ئەکا تا بە داد و یەکسانیی بە کاردکەی هەڵسێ و ستەم نەکات ، خۆ ئەگەر لای دا و دەستی دایە جیاوازیی ، ئەوا خوای گەورە دەستی لێ بەر ئــەدا و شەیتانیش باوەشی بۆ ئەگرێتــەوە ، بۆیە پێغەمبــەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ :

**« ان الله مع القاضي ما لم یجر ، فاذا جار تخلی الله عنه ولزمه الشیطان » رواه ابن ماجة والترمذي وحسنه .**

هەروەها دەری ئــەخا سێ جــۆر قازیی هــەیە :

یەکێکیان بەهەشتییە و ئەو دوانەکـەیش دۆزەخین ..
ئەوەیان کە بەهەشتییە پیاوێکە شارەزای راستییەو لـە کاروباری موسـڵمانانـدا بـە کاری ئـەهێنێ ، بـەڵام دوانەکەی تر : یەکێکیان پیاوێکە شـارەزای راسـتییە کەچی رەفتی پێ ناکا و هەوا و ئارەزووی بە کار ئەهێنێ و جیاوازیی ئەخاتە نێوان ئادەمییەکانەوە و دۆزەخییە.. ئەوی تریشیان پیاوێکە کوێرانە بە بێ شارەزایی بڕیـار دەر ئـەکا و مافی خەڵـکیی پێشـێل ئـەکا و ئـەمەیش دۆزەخییە ... ئەوەتا پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەفەرموێ :

**« القضاة ثلاثة : واحد في الجنة ، واثنان في النار . فاما الذي في الجنة فرجل عرف الحق فقضى به ، ورجل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النار . ورجل قضى للناس على جهـل فهـو في النـار » . رواه أبو داود والترمذي والنسائي وابن ماجة والحاكم وصححه .**

/ بەڵێ ئاینیی پاکی ئیسلام فەرمان ئەدا بە سەرقازییدا کەوا لـە پێنج شـتا بـە یەکسانیی لەگەڵ هەردوو لایەنی

ناکۆکیدا بجوولێتەوە :

١ ــ لە چوونە ژوورەوەدا •

٢ ــ لە دانیشتن لە بەر دەمیدا •

٣ ــ لە رووتێ کردنیاندا •

٤ ــ لە گوێ گرتن بۆیاندا •

٥ ــ لە بڕیار و حوکمدان بە سەریاندا •

جا ئەوەی ئەمڕۆ ئادەمیەکان بە دەستیەوە ئەناڵێنن ئەو جەور و ستەمەیە کە بە ناوی سەربەستی و یەکسانیی و دادەوە لە گەڵیان ئەکرێت •• لە هەمان کاتدا دادگای ئیسلامیی و دادپەروەریی موسڵمانان لێیان شاراوەتەوە و بە خۆیشیان نازانن چ ستەمێکی گەورەیان لێ کراوە ••

جا وا بە پشتیوانیی خوای گەورە هەڵوێستی مامۆستایەکی خواناس ئەخەینە بەردەستی موسڵمانان تا بزانن قوتابیانی قوتابخانەی پێغەمبەر ــ صلی الله علیه وسلم ــ چەند بەرز و پایەدارن و چەندیش خزمەت بە

هەزاران ئەکەن ..

هیواداریین خوای گەورە دڵمان ڕاگیر کا لە سەر مەبەستی خزمەتکردنی ئاینە بێگەردەکەی ، تا بەڵکو سەرفرازی دادگای قیامەت بین ..

**شەممە چواردەی شەعبانی ١٤٠٥ك**
**چواری مایسی ١٩٨٥ل**

« ١ »

جیهانی ئیسلامیی خاوەنی خۆی بوو •• بیروباوەڕی ئیسلام دەستی کێشا بوو بە سەر ژیانیا •• ئەگەرچی کەم و کورپیەك لـە هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵاتـا بوو بێ ، لـە چاو هەندێ وەزعی تردا ئەوپەڕی بەختەوەریی بووە •• قورئانی پیرۆز دەستووری موسڵمانان بوو •• ڕۆڵەکانی موسڵمانەکان بـە پەروەردەی ئیسلامیی گۆش ئەکران •• مێشکیان بە ئایەت و فەرموودە ڕۆژ بە ڕۆژ چاکتر ئەکرایەوە •• قوتابخانەکەی پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لـە هەموو شـار و گوندێکدا دەوری خۆی ئەبینی •• ڕۆڵەی خوێن گەرمی مێشك سافی دەروون پاکی پێ ئەگەیاند •• ڕۆشنایی ڕژا بوو بە سەر موسڵمانەکانا •• سەربەرزی دنیـا و قیامـەت بوون •• زانایان دەوریان هەبوو •• زانیاریان لە پێناوی خـوادا بڵاو ئەکردەوە •• ڕاستیان دەر ئەخست •• دژی ناڕەوا

نەوەستان ، بۆیە بە هیچ شێوەیەك كافران نەیانئەتوانی بیر لـە زیانی موسڵمانان بكەنەوە ••

كە موسڵمان دیمەنی ئوممەتێكی گـەورە و زۆری بەرفراوان دێنێتـە بەر چاوی ، كەدا بـە رێبازی ئیسلام كاروبـاری هـەڵ ئەسـووڕێنێ •• شەیدای زانین و زانیاریی بووە •• خەریكی خوێندن و لـەبەركردنـی قورئان و فەرموودەیە •• بـە دەست و دەم و دڵێـكی پاكەوە هاتۆتە مەیدانی ژیانەوە ، كاتێ موسڵمان ئـەمەی دێت بە بیرا بەزەیی بـە ئادەمیزادی سەرگەردانی دەست بیروباوەڕە ئیلحادییەكانا دێتـەوە ••

بەڵێ ، تـا ئیـسلام لە كۆڕی ژیانا بوو و بەرنامەی ژیانی ئادەمیـزاد بوو ، زۆر و زەبـەندە پیاوی هـەڵ خست •• پەروەردەی كردن •• بوونە شەیدای زانین و راستیی و برایەتیی و یەكسـانیی •• یەكێ لـەوانـە موسڵمانێكی بلیمەت و لێهاتوو بوو كە ناوی شـەریكی كوڕی عەبدوڵلا بوو = كە بە ئەبووعەبدوڵلای نەخەعیی

ناسراوه •• لـه ناوچەی کووفەدا ، قازیی موسڵمانەکان بوو •• بە پێی شەریعەتی خوا بڕیاری دەر ئەکرد ••

شەریك لـە شاری بوخارای ناوچەی خۆراسـان لـە ساڵی ٩٥ك ـ ٧١٣ل لـە دایك بووە •• باپیریشـی بەژداریی جەنـگی قادسـیەی کـردووە ، وە فریـای سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کـەوتووە •• خوا وای بۆ هێنایە پێشەوە ببێتـە قوتابـەکی بلیمەتـی قورئان ، وە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە مامۆستا تابعیەکان وەر بگرێ بە تایبەتیی ئەبوو ئیسحاقی سەبیعیی و مەنصووری کوڕی مەعتەمیر و عەبدوڵڵای کوڕی عومەیر و سەمماکی کوڕی حـەرب وە سولەیمانی کوڕی ئەعمەش • هەروەها کۆمەڵێك لـە مامۆستایانی فەرموودە فەرموودەیـان بـە ددمـەوە گێڕاوەتەوە ، لەوانە : عەبدوڵـڵای کوڕی موبـارەك و وەکیعی کـوڕی جـەڕڕاح و عـەبدوڕەحمانی کوڕی مەهدیی و خەلەفی کوڕی هیشام ••

شـەریك ژیانی بۆ ئیسـلام تەرخان کردبوو ••

خەریکی وەرگرتن و پێشکەش کردنی زانیاریی قورئان بوو .. بۆیە بە وڵاتانی ئیسلامدا ئەگەڕا و سەری لە مەڵبەندە ئیسلامیەکان ئەدا ، ئەو مەڵبەندانەی کە چرای بەختیاریی موسڵمانەکان بوون ، بە تایبەتیی بەغدای پایتەختی موسڵمانان و قەڵای عیلم و زانیاریی و مەڵبەندی پێش کەوتن و شارستانییەت .. چەند جارێ سەری لێ داوە و وانەی تیا وتۆتەوە و ئامۆژگاریی بە موسڵمانەکان پێشکەش کردووە .. ئینجا لە سەردەمی عەباسیەکاندا کراوە بە قازیی شاری کووفە و دوای ئەویش شاری ئەهواز .. بەم شێوەیە بە سەرنجدان لە ژیانی دەر ئەکەوێ هەموو تەمەنی پیرۆزی لە خزمەتی ئیسلام و موسڵمانەکانا بە سەر بردووە ..

وە زانایان و مێژوونووسانی ئیسلام زۆر بە رێزەوە ناوی شەریك ئەبەن ..

ئەوەتا ئیبن خەلەکان لە مێژووەکەیدا باسی داد و راستیی و پێکان و وەڵامئامادەیی ئەکات کە ئەڵێ :

« كان عادلا في قضائه ، كثير الصـواب ، حاضر الجـواب » .

وه ئيبن كه‌ثير لـه مێژووه‌كه‌يدا ده‌ری ئه‌بڕێ هـه‌ر حوكمێك شـه‌ريك ده‌ری كـردبێ راسـت و شه‌رعيی بووه بـه جوانیی جێ به جێی كردووه و كه‌س لێی ناڕازيی نه‌بووه كه ئه‌ڵێ :

« وكان مشكورا في حكمه وتنفيذ الأحكام » .

وه مامۆستا ئيسحاق ئه‌زره‌ق باس ئه‌كا كه‌وا نۆ هه‌زار فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ری ـ صلى الله عليه وسلم ـ لـه ده‌م شه‌ريك وه‌ر گرتووه ..

وه ئه‌وه‌نده لـه فـه‌رمووده‌دا شـاره‌زا بووه تـا عه‌بدوڵلای كوڕی موباره‌ك[1] بڵێت : ئه‌و شـاره‌زاتره له‌و فه‌رموودانه‌دا كه له ناو دانيشتوانی كووفه‌دا بڵاون

---

(١) لـه سالی ١١٨ يان ١١٩ك له دايك بووه و لـه ١٨١ك كۆچی دوایی كردووه .

لـه سوفیانی ئەوری[٢] .

وه ئیمامی نەسائیی لە بارەی وەرگرتنی فەرموودەوە لێی ، ڕەزامەنـدیی خـۆی دەر ئـەبڕێ و پلە بۆ ئـەو فەرموودانە کـە ئەو ئەیانگێڕێتەوە دا ئەنێ کە ئەڵێ :

« لیس به بأس » .

وه عیسای کوڕی یوونس باسی خوانامیی و لـە خوانرسانی ئەکا کە کەسی نەبینیوە وەك ئەو ، ئەڵێ :

« ما رأیت قط أورع في علمه من شریك » .

خەطیبی بەغدادیی لە مێژووی بەغدادا چیرۆکی گەورەبوون و زانیاریی وەرگرتنی شەریکمان ئەخاتـە پێش چاو :

جارێکیان شەریکی قازیی بە لای موستەنیری کوڕی عـەمری نەخەعیدا تێ ئەپەڕێ ، لا ئەداتـە لای و دا ئەنیشێ ، لـە شەریك ئەپرسێ : باوکی عەبدوڵـلا کێ

---

(٢) لە سالی ٩٧ك لە دایك بووە و لە ١٦١ك کۆچی دوایی کردووە .

تۆی وا پەروەردە کرد و فێری خووڕەوشتی جـوانی کردی ؟ ئەڵێ : خۆم خۆمم فێری خووڕەوشت کرد !!
لە ناوچەی خۆراسان و شاری بوخارادا لە دایك بووم ..
ئامۆزایەکمان بردمی بۆ لای مامەیەکم لە نزیك رووباری صـەرصـەر .. هـەموو جـارێ ئـەچووم لـە لای مامۆستایەکیانا ـ کە قورئانی فێر کردوون ـ دا ئەنیشتم ، منیش بەرە بەرە دڵم چووە سـەر فێربوونی قورئـان و چوومە لای گەورە مامۆستاکەیان و پێم وت : مامە گیان، ئەوەی لێرە بۆم خەرج ئەکەی لە کووفە بۆم خـەرج کـە تـا خۆیشم و خزمەکانیشم ( واتە : هۆزی نەخەع کە لـە دەور و بەری کووفەدا ژیاون ) فێری سـوننەتی پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ ببین.. ئەویش بـە گوێی کردم ..
بەم شێوەیە دێتەوە بۆ عیراق و لـە شاری کووفەدا ـ کە ئەو سەردەمە جێی زانین و زانایان بوو ـ دەست ئەکا بە خوێندن ، بەڵام هەرچەندە خەرجی ئەکێشن ، لەگەڵ ئەوەشا دەست ئەکا بە شیردۆشین و فرۆشتنی

بــه قازانج و به پارەکەی دەفتەر و پێویستیی نووسین نەکڕێ و فەرموودە و زانیاریی تیایانا ئەنووسێ •• ئینجا دوای ئەوە دەست ئەداتە فێربوون و شــارەزا بوون لــە فیقهی ئیسلام و ئەبێتــە زانایەکی بەرز ••

کاتێ شەریك ئەمەی گێڕایەوە بۆ موستەنیر ، زۆر بە لایەوە ناوازە بوو •• منالێك خۆی نەخشە بکێشێ بۆ پەروەردە و فێرکردنی خۆی •• بۆیە بە منالەکانی وت: ونەی ئامۆزاکەتانتان بیست ؟ منیش چەندێ لە گەلتانــا خەریك ئەبم و ئامۆژگاریتان ئەکەم کەچی هیچتان پێوە دیار نیــە •• جا کێتان توانای هەیە با خۆی پەروەردەی خۆی دا بدات ! ئەو کاتە کێ چاکەی کرد بۆ خــۆی ئەبێ و کێش خراپەی کرد لــە سەر خۆیەتی(۳) •

(۳) دیارە ئەمە دوای تەواو کردنی ئەرکی سەر شان لە پەروەردە کردندا ، ئەگینا منال هەمیشە ناتوانێ وەك شەریك خەمخۆری خۆی بێ !!

« ٢ »

رۆژان تێپەڕین و فەرمانڕەوایی ئوممەتی ئیسلام کەوتە دەست عەبباسییەکان .. ئەو کاتە ئیسلام بەرنامەی ژیانی موسڵمانان بوو و خەلیفەکانیش بە پێی شەریعەتی ئیسلام ـ ئەگەر چی کەم و کورپیشیان بوو بێ ـ کاروباری میللەتیان جێ بەجێ ئەکرد .. کە یەکێ لەوانە هەڵبژاردنی پیاوێکی زانای دەستپاکی لەخواترس بوو تا کاروباری دادگای ئیسلام بە پاکیی بەرێت بە رێوە و موسڵمانان مافیان نەفەوتێ ..

دیارە زانای بەرز و تێگەیشتوو نەبوایە کەس نەیئەتوانی کاروباری خەڵق بەرێ بە رێوە . وە ئەوانە لە لایەن خەلیفەوە هەڵئەبژێرران و لە شارەکانی جیهانی ئیسلامیا ـ بەو فراوانیی و پان و پۆڕییەوە ـ دا ئەنران .. خۆ ئەگەر خۆیان لێ لا بدایە خەلیفە ، بە فەرمانی شەرع ، ناچاری ئەکردن ..

زاناکانیش ـ بەر رەحمەتی بەلێشاوی خوا کەون ئەوەندە لەخواترس بوون ، هەوڵیان ئەدا بە هیچ شێوەیەك نزیکی کاربەدەستان نەبنەوە ، چ جای کاریان بۆ هەڵ سووڕێنن ، چونکە :

**یەکەم :** دایان ئەنا کاربەدەستان بە تەواوەتیی بە پێی شەریعەت ناجووڵێنەوە و کەم و کوڕییان هەیە ..

**دووەم :** ئەگەر ئەمانیش کاروبار بگرنە دەست و ببنە ئەندامێکی میریی ، ئەوا ئیتر بۆیان نیە هیچ رەخنەیەك لە وەزع بگرن ..

**سێیەم :** پێویستە زانایان هەمیشە سەربەست بن ، تا جەماوەری موسڵمانان لە راستێتیی شەریعەت تێ بگەیەنرێت و هەرچی لادانێك لە ژیانیا روو بدات خێرا ئاگادار بکرێت ..

لە لایەکی ترەوە سەیریان ئەکرد هەڵسووڕاندنی کاروباری دادگای ئیسلام ئەرکێکی زۆر گرانە و زۆر بە زەحمەت موسڵمان ئەتوانێ پێی هەڵسێ ، تا خوای

گەورەی لێ نەڕەنجێ و کەس ماف خوراو نەبێت ..
جا وەك ئەمان بە کارێکی پڕمەترسیان دا ئەنا خەلیفەکانیش هەستیان ئەکرد جێبەجێکردنی پێویستیی موسڵمانان و بڕینەوەی گیروگرفتەکانیان بە یەکسانیی و داد کارێکی سەختە و هەموو کەسێ پیاوی ئەو مەیدانە نیە ، بۆیە بە شێوەی پەلەقاژە و هانابردن دەسەدامێنی زانایان ئەبوون و زۆر جاریش ناچاریان ئەکردن وە یا زۆر و ترسیان ئەخستە بەر دەمیان تا کاری دادگای ئیسلام بەرن بە رێوە ، جاری وایش ئەبوو هەڕەشە ئەکرا لە هەندێك بە کوشتن ..

بەمە زۆرانبازیەکی توند و تیژ لە نێوان خەلیفە و زانایاندا رووی ئەدا .. هەر لایەك ئەیویست باری سەرشانی خۆی سووك کا و رەنگ زەردی رۆژی قیامەت نەبێ .. ئەوانە ئەکران بە قازیی هەوڵیان بۆ نەئەدا ، بەڵکو داوایشیان نەئەکرد .. بۆ هەڵێ ئەگەڕان لە کاروباری میریی شانیان سووك بێت .. ئەوەندە لایان

مورس و گران بوو ، نەوەکو بە نەزانیی و شوێن کەوتنی هەوا و ئارەزوو ستەم بکەن و بکەونە بەر ئەو هەڕەشانە کە خوا و پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ کردوویانن لـە ستەمکاران ..

پێشەوایانی ئیسلام ـ ڕەحمەتی خوایان لـێ بێ ـ زۆر و زەبەندە ئازار و چەرمەسەرێ دراون لـە سـەر ئامادە نەبوونیان تـا بکرێنە قازیی بۆ هەڵسـووڕاندنی کاروباری دادگا ..

لـە پێش هەمووبانەوە پێشـــەوا و بـەڕێزمـان ئەبووحەنیفە ـ خوا لێی ڕازیی بێت ـ چەند جارێ بانگ کرا بۆ ئەوەی بکرێتە قازیی و هەوڵێکی زۆری لە گەڵا درا ، کەچی هەر ملی بێ نەدا و ملی بێ نەدا تـا ئـەوە بوو خەلیفە لـە رقـا ئەیخستە بەندیخانـەوە !! هـەتـا ئەبوویووسفی قوتابیی بـە ئەبووحـەنیفەی مامۆسـتای ئەڵێ : ئەگەر کاروباری دادگات بگرتایەتە ئەسـتۆ ، کەلکت بە خەڵك ئەگەیاند ..

نەك تەنها ئەبووحەنیفەی خوانـاس و دڵسۆزی ئیسلام ، بەڵکو ئـەوەتـا موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانیی ، کە هاوەڵی ئەبووحەنیفـە بوو و یەکێکە لـە زاناکانی مەزهەبی حەنەفیی ، ئەویش بانگ نەکرێ تـا بیکەنە قازیی .. تـا ماوەیەك هەر مل نـادا تـا کـۆت و زەنجیر ئەکەنە دەست و پێی و ئەیخەنە بەندیخانەوە لـە دوایدا ناچار بوو پێی هەڵسێ ..

وە قازیی ئەبووخوزەیمە ئیبراهیمی کوڕی یەزیدی رەعینیی ، کە لـە ساڵی صەد و چل و چواردا قـازیی میصر بووە ، لـە لایەن ئەمیری میصـرەوە ، یەزیدی کوڕی حاتەم ، کە ئەبووجەعفەری مەنصوور دای نـا بوو ، هەڕەشەی لێ کرا ئەگەر نەبێتـە قازیی بە شمشێر ئەدرێت لە ملی ، وە بـە راسـتییش شـمشێریان هێنا و خـەریـك بوو بی کوژن ، ئـەوسـا کۆڵی دا و دادگای وەرگرت ..

هەروەها مامۆسـتـای خوانـاس حەیـاتی کـوڕی

شورەیح بانگ ئەکرێ بۆ وەرگرتنی دادگای میصر ٠٠ ئەمیر فەرمانی بە سەرا دا کە ئەبێ ببێتــە قازیی ، ئەمیش نارەزایی دەربڕیی و دەری خست ئامادە نیە ، بۆیە ئەمیر ناچار پەنای بردە بەر زۆر و داوای شمشێرێکی کــرد ، تــا بەشکوم بیترسێنێ ٠٠ کاتێ مامۆســتا ئەمەی بینی کلیلێکی پێ بوو و دەری هێنــا و وتی : ئــەمــە کلیلــی مالــەکەمە و زۆریش بێتاقەتی پــەروەردگارم ، واتــە شانازیی پێوە ئەکەم بە شەهیدیی سەر بنێمەوە ٠٠ کاتێ ئەمیر زانیی چۆن پیاوێکە و بە کەس کۆڵ نادا ، وازی لــێ هێنــا و خواحافیزیی لێ کرد ٠٠

بەڵێ قوتابخانەی قورئان پیاوی پیاوانە هەڵیــــان ئەسووڕان ٠٠ بــە مەردانە ئــاڵایان بــەرز کردبۆوە بۆ بانگی « لا الــە الا الله » ٠٠

بەڵێ ، بۆمان دەر ئەکەوێ چەند ستەمێکی گەورە ئەکرێ لــە ئادەمیزاد ، نە کاتێکا کە دوژمنەکانی بەرگی دۆستی خەمخۆریان لە بەر کــردووە و ئەیانــەوێ لــە

خواپەرستیی ، لـە بەرنامەی ئیسلام دووری خەنەوە و رای کێشنە ناو زۆنـگی نەگبـەتیی و چـارەڕەشـیی و بێئابڕوویەوە .. بە زمانـی لـووس ئەیانـەوێ بەوە بیخەڵەتێنن کە گوایـا ئیسـلام پشـتگیری زوڵمە و ئەوانیش هی داد و یەکسانیی .

ئەو رۆژە قوتابخانە پیرۆزەکەی ئەبووحەنیفـە و ئەوریی و کوڕی موبارەك نەخشەی وەها بۆ خۆی کێشا بوو هەتا بۆیان بکرێ ناوچاوی خەلیفەکانیش نەبینن .. ئەو خەلیفانەی ، کە دوای پێغـەمبـەران و جێگـــرە راستەقینەکانیان ، هەر تەنها ئەوان تروسکەی رۆشنایان لێوە بـە دی ئەکرا .. ئەو خەلیفانەی کە حوکمیان بـە قورئان ئەکرد .. لـە رۆژهەلات و رۆژئاواوە نامـەی سەربڕینی موسڵمانانیان بۆ نەئەهات ..

کاتێ ئەم بەراورد، ئەکەین لەگەڵ ژیانی خۆمانا ، سەرداخستن و شیوەنیش کەڵکمان پێ ناگەیەنن.. تەنها چارمان ئەوەیە وەك ئەو مەردانە دەست بگرین بـە

قورئانەوە و داوای کۆمەکیی لە خوای گەورە بکەین دامەزراومان کات ، تا لە دڵمانا جێگیر بێ هیچ مل‌هوڕ و ستەمکارێ بە بێ فەرمانی خوا توانای نیە ریانمان پێ بگەیەنێ .

جا ئەگەر زانایەکی هاوەڵیان پێی هەڵ بکەوتایە و بە هەر شێوەیەك نزیکی کۆشکی خەلافەت و دەزگای دەوڵەت بکەوتایەتەوە ئەوا بە جارێ بە لۆمە و گلەیی دایان ئەگرتەوە :

چۆن زانای موسڵمان ئەکەوێتە ئەو زۆنگاوەوە ؟ ئەی کێ بەرەی تازە لە سەر ئیسلام پەروەردە بکا و وانەی مەردایەتیی پێ بڵێت ؟

ئەوە بوو یەکێك لە زانا بەرزەکان ، کە ناوی ئیسماعیلی کوڕی عەلیە بوو ، کاروباری دادگای گرتە دەست و عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکیش هەواڵی زانیی.. عەبدوڵڵا و ئیسماعیل زۆر نزیك و خۆشەویست بوون.. ئەم کردەوەیەی بە دەرچوون لە قوتابخانەی قورئان

دا ئەنا و هیچ بیانوویەکی لێ وەر نەئەگرت •• لە ڕاستیدا نەبردنە سەری پەیمانی سەرشان بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای « لا اله الا الله » هیچ بیانوویەك پینەی ناکا •• ئیسماعیلی وا دا نەنا بووە بە پیاوێکی میریی و پەیوەندیی نەماوە بە قوتابخانەی پێغەمبەری خواوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ بۆیە ئەم دوو دێرە هەڵبەسەی خۆیی بیر خستەوە :

وهل بدل الدين الا الملوك
وأحبار سوء ورهبانها ؟؟
لقد رتع القوم في جيفه
يبين لذي العلم أنتانها ••

بیری ئەخاتەوە کە بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری کردووە : ئایا جگە لە پاشایانی دونیاویست و قەشە و مالوومی ئایینفرۆشی بەناوزانا ، کەسی تر ئایینی خوای دەستکاریی کردووە ؟! وە مەگەر تەنها زانای خواناس بزانێ بۆگەن و گەنیویی لاکی تۆپیو ـ کە دونیاپەرستییە ـ

بەندە ، کەچی وا خەڵکیی بە جارێ سەریان تێ کردووە ..

موسڵمانان و کۆمەڵی موسڵمانی ئەو کاتەی بەغدا، کە پایتەختی دەوڵەتی قورئان و پایتەختی شارستانیی جیهان بوو ، بەو شێوە ئەدرانە قەڵەم ، جا ئەی موسڵمانی بەڕێز خۆت و شیرت سەبری هەڵوێستت کە .. سەیری ئەو بەناوزانایەی ئەمڕۆ بکە کچەکەی بە رووتیی ئەسزوورێتەوە و ئیتر لۆمەی رەش و رووت و عەوام مەکە و بیرت بخە کار و بزانە چی بکەین چاك بێ تا لە قوتابخانەی ئەو بەڕێزانەدا وەر بگیرێین ؟

بەڵێ ، بگەڕێ .. بگەڕێ بە شوێن زانای خواناسدا و دەسەدامێنی بە تا لە دانیشگای ئیسلامدا ناوت تۆمار کا و پێناسەی شەهیدیت لە باخەڵ نێ ! .

ئینجا مامۆستای بەڕێز و دڵگەرم عەبدوڵلای کوڕی موبارەك بەم هۆنراوانە دەست ئەداتە گلەیی و بۆڵەیەکی ترش و تاڵی برای خۆشەویستی ، ئیسماعیلی

کوڕی عەلیە ، کە کاروباری دادگای گرتۆتە ئەستۆ ، ئەلێ :

یا جاعل العلم لـه بازیـا
یصطاد أمـوال المسـاکین
احتلت للدنیـا ولـذاتهـا
بحیلـة تذهـب بالـدین
فصرت مجنونا بها بعد مـا
کنـت دواءا للمجـانین
أین روایـاتك في سـردها
لترك أبـواب السـلاطین ؟؟
أین روایاتـك فیما مضـی
عن ابن عوف وابن سیرین؟؟
ان قلت أُکرهت ، فذا باطل
زلّ حمار العلم في الطین !

هۆنراوەکان زۆر دڵتەزێن بوون ، هێشتا ئیسماعیل شتی وا رەقی پێ نەوترا بوو ..

مامۆستا وەك دەستی هەڕەشە و ناڕەزایی بۆ بەرز

بەلاوە کە کارێکی زۆر ناهەمواری کردووە ، پێی ئەلێ:

ئەی ئەو کەسەی رانیاریت بە هــەرزان دەســت کەوتووە و ئــەتــەوێ بی کەیتە بازێــك بۆ راوکردن و چینەوەی پارە و سامانی هەژاران ‥ فێلت دۆزیوەتەوە بۆ دەست کەوتنی دنیا و نەزەت و رابواردنەکەی ، بەلام فێلەکەت فێلێکە ئاین لە ناو ئەبات ‥ چونکە ئەو دڵەی خۆشەویستی دنیای تیا جێ بوویەوە ئیتر جێگای ئاینی تیا نابێتــەوە ‥ ئــەمڕۆ تۆ خــۆت بوویتە شــێت و سەرگەردان بوویت ، دوای ئەوەی جاران دەرمانی شێت و هــاران بوویت ‥ کوا ئەو فــەرموودانــەی کــە ئــەتگێڕانــەوە تــا هاندەر بن بۆ دوورکەوتنــەوە و پشتهەڵکردن لە دەرگای پاشا و میرەکان ؟؟ کوان ئەو چیرۆکانەی کــە ئەتگێڕانــەوە لە مێژووی هاوەڵان و تابعین ، وێنــەی عەبدوڕڕەحمانــی کــوڕی عــەوف و موحــەممەدی کوڕی سـیرین ؟ واتــە ئــەو وتــە و ئامۆژگاریانــەی ئەو کاتــەت لە چی و ئــەم بــەزمەی ئەمڕۆت لە چی ؟

جا ئەگەر ئەڵێیت : ناچار بووم و زۆر لێ کراوم ، ئەوەش هەر ناڕەوایە و باری سەرباره ، نەخێر هیچ نیە جگە لەوەی کوێ‌درێژی زانیاریی‌بار لە قوڕا چەقیوە!!

وتەکانی مامۆستا زۆر ڕەق بوون ، جا کاتێ ئیسماعیل خوێندنیەوە ، کارێکی گەورەیان کردە سەر دڵ و دەروونی .. حەسانەوەی نەما .. تووشی خورپە و دڵەتەپە هات .. هەر تەنها بە خوێندنەوە ئارامی لا نەما .. سەری ئەخولایەوە .. خەو لە چاوەکانی باری کرد .. کەوتبووە ناو لیتەوە و نەیشی ئەتوانی خۆی دەرباز کا ، وەك بە خۆی بڵێ :

چەند دڵم بە خۆم خۆش بوو شارەزای ئیسلامم .. خزمەتی بکەم .. موسڵمانەکان وتەم ببیستن .. لەگەڵ موسڵمانانا بژیم و لە گەڵیشیان حەشر بکرێم .. کەچی وا ئیستا مامۆستایان و پێشەوایانم لێ ڕەنجان .. ئەوانەی وا پێشەنگی قافڵەن بۆ گەیاندنی ئاینی خوا .. ئای ڕەنجەڕۆ خۆم .. سەرگەردان خۆم ..

ئەمە بیرکردنەوەی ساتێکی نەبوو .. هەمیشە بوو،
ناچار بوو تاکە رێگای سەرفرازبوون بدۆزێتەوە کە
رێیی بوو لەوەی بچێتە لای ئەمیری ئیمانداران
هاروونورڕەشید تا وازی لێ بێنێ و کاری دادگا بە
کەسێکی تر بسپێرێ .. ئەوەندە داواکەی دووبارە
کردەوە تا خەلیفە دەستبەرداری بوو ..

ئەمە چەند نموونەیەکی کەم بوون لە چاو زانای
خواناس و بلیمەت و چاونەترسی زۆر و زەبەندەی
ئوممەتی ئیسلامدا ، کەوا بە هۆیانەوە ژیانیان بێ پێچ و
پەنا دێتە وەلام و بە مرۆڤایەتیی ئەسەلمێنێ کەوا :

تەنها پەروەردەی قورئان پیاوی چاکویستی
چاونەترسی بلیمەت و بەغیرەت پێ ئەگەیەنێ تا خزمەت
بە گرۆی ئادەمیی بکەن .. سوپاس بۆ خوای
هیدایەتدەر .

« ٣ »

شەریکی نەخەعیی ـ وەك صەدەها زانای بلیمەتی سەردەمی خۆی ـ بووە شارەزایەکی راستەقینەی ئیسلام •• وەك مێشکی پڕ بوو لە زانیاریی ، دڵەکەیشی پڕ بوو لە ئیمان •• بۆیە بە چاکیی حەزی لە خزمەتی شەریعەتی ئیسلام بوو ••

بەڵام هەر ئەوەندە بوو ناوبانگی دەر کرد خێرا خەلیفە ئەبووجەعفەر بە هەلی زانی تا لە دادگای ئیسلامدا دایمەزرێنێ و کەمێ باری سەرشانی موسڵمانەکانی پێ سووك بکا •• بۆیە ناردی بە شوێنیا و ئەویش لە کووفەوە لێی دا و خۆی گەیاندە لای خەلیفە •• خەلیفە پێی وت : ئەمەوێ بتکەمە قازیی کووفە •• ئەمیش پێی وت : دەستم لێ بەر دە ئەی ئەمیری موسڵمانان ••

هەر چەند شەریك هەوڵی دا ، خەلیفە لە سەر رای

خوی دانەبەزیی و وازی لیٚ نەهێنا•• وتی : ددی ئەمڕۆ ماوەم بدەن ئەڕۆم و دوای ئەوە ئەگەڕیٚمەوە تا ئەمیری ئیماندااران بڕیاری خۆی بدات ••

شەریك ئەیویست ئەو ڕۆژە خۆی لە چنگی مەنصوور داماڵیٚ و ئیتر نەگەڕیٚتەوە •• ماوەیشی بۆ گەڕانەوەکەی دیاریی نەکرد •• بەلاّم خەلیفەکان ، هەر هەموویان ، وەك ئەیانزانیی خۆیشیان و موسلمانەکانیش چەند داماون بۆ زانیاریی و خواناسیی زانایان ، لە هەمان کاتا ئەیانزانیی ئەمانیش چەندە لە لیٚپرسراویی ئەترسن و خۆیانی لیٚ لا ئەدەن •• مەنصووریش خیٚرا بە نیازەکەی شەریکی زانیی و تیٚ گەیشت ئەیەویٚ خۆی داماڵیٚ بۆیە پێی وت :

ئەتەویٚ لێرە دەرچی و خۆتم لیٚ بشاریتەوە ؟! بە خوا شتی وا بکەی هەرچی تۆ پێت ناخۆش بێت بەرامبەر بە پەنجا پیاو لە خزمەکانت پێی هەڵ ئەسم ••

شەریك بۆی دەرکەوت هێرش و دەستوەشاندنی

خەلیفە هەر بۆ خۆی نیە و هەرگیز ئەو سوێنەی ناخات .. لــە بەر ئەوە ناچار بوو و گەڕایەوە لای و ئەویش فەرمانی بۆ دەر کرد تـا ببێتــە قازیی کووفــە ..

شەریك بەرەو کووفە گەڕایەوە .. بەوپــەڕی ناڕەزاییەوە دەستی دایە کارەکەی .. بەڵام هەر بە تەما بوو را کات و لــە حکوومەتی نــەوەی عەبباس خۆی بشارێتەوە .. دیسان حکوومەت بە نیازەکەی زانی و لە هەڵوێستی ئاگادار بوو ، بۆیــە بــە ناچاریی کۆمەڵــێ پۆلیسی بە دیارەوە را گرت تا چاودێری بن و مــاوەی نەدەن را بکات .

لە ترازووی پێشەوایانی ئیسلامدا شەریك بە لاواز دەرچوو ، کە ئەویش ناهەقی نەبوو چونکە شەرمەزاری خزمەکانی ئــەبوو ، لە سەر ئەو تووشی مەینەت و سزا بێن ، بەڵێ لاواز بوو نەیتوانیی وەك هەندێکی تریـان تــا سەر سوور بێ و کۆڵ نەدا ..

جـا بـا بزانین ئــەم مامۆستا بەڕێزەمـان چــۆن

هەنگاو هەڵ ئەگرێ ؟

ئایا کاری سەرشان و پایە و پلەی دادگا تا کوێ ئەتوانێ رای کێشێ بە شوێنی خۆیا ؟

ئایا بە تەواویی بە لاواز دەر ئەچێ و مل کەچ ئەکا بۆ دونیا و شان شل ئەکا بۆ دەسەڵاتداری رۆژگار؟ یان دەری ئەخا زانای موسڵمانی خواناس ، بۆ قیامەت نیش ئەکا و لە هەر بارێکدا بێت ئازایەتیی و پاڵەوانێتیی خۆی و راستیی و پاکیی رێبازەکەی ئەسەلمێنێ ؟

با بزانین، هەروەك مامۆستاکانی تر بوونە نموونەی موسڵمانی چاونەترس تا موسڵمانەکان هێز و پێزیان لێ وەر گرن و لە هیچ هێزێکی نەفامیی سڵ نەکەن ، ئەمیش توانیی بێتە چرای سەرە رێگا بۆ ئەو موسڵمانە بێچارانەی کە گیر ئەخۆن و شەوەزەنگی نەفامیی و نەفامان تەنگیان پێ هەڵ ئەچنن ، تا نیشانیان بدا چۆن هەنگاو هەڵگرن و کاری سەرشانیان لە بیر نەچێتەوە .

مامۆستای خواناسمان بە جوانیی لە شەریعەت

شـارەزا بوو •• بۆیـە بـە ڕێـك و پێكیی لـە گەڵیـا ئەجووڵایەوە •• هـەرچی ڕێگایەك پێویست و بەكەڵك بوایە ئەی گرتە بەر ، تـا بە چاكیی و پاكیی لە كاروباری موسڵمانان تـێ بگا و بە یەكسانیی سـەیریـان بـكا و بڕیارەكانی دوور بن لـە ستەم و جـەورەوە •• ئـەوە بوو بـە برسێتیی دەستی نەئـەدایە هیچ مەسـەلەیەك و مەحكەمـەی كەسـی نەئـەكرد ، بەڵكو ئەبوایـە نانی بخواردایـە تـا وزە و هێـزی لاشـەیی و مێشـكیی و دەروونیی لـە جێی خۆیا بێت و بە تەواوەتیی لەسەرخۆ بێت ، وە دەستنوێژی ئەگرت و ئەچووە مزگـەوت و دوو ڕەكعەت نوێژی بۆ خوا بەجێ ئەهێنـا •• ئەوسـا ئەچووە شوێنی تایبەتیی خۆی و پارچـە كاغەزێكی لـە گیرفانیا دەر ئەهێنا و سەیرێكی ئەكرد ، وەك شتێكی زۆر گرنگی بیر بخاتەوە • جا ئەیخستەوە گیرفانی و فەرمانی ئەدا با یەك لـە دوای یەك خەڵكیی بێنە ژوورەوە تـا لـە گیروگرفتیان بكۆڵێتـەوە ••

هەموو ڕۆژێ شەرێك ئەو پارچە كاغـەزەی لـە

ئیرفانیا دەر ئەهێنا و ئەیخوێندەوە و ئەیخستەوە شوێنی خۆی .. ئەمە وای کرد لە هاوەڵانی هەوڵ بدەن بزانن نهێنیی ئەو پارچە کاغەزە چیە و چی تیا نووسراوە .. هەر چۆن بوو کاغەزەکە دەست خرا و سەیر ئەکەن ئامۆژگاریی بۆ خۆی تیا نووسیوە تا هەموو جارێ بیری کەوێتەوە کەوا پردەکەی قیامەت زۆر تەسکە و هەڵوێستی بەر دەستی خوای گەورەی لە یاد بێت کە تیایا نووسی بووی :

**یا شریك بن عبدالله اذكر الصراط وحدته !!**
**یا شریك بن عبدالله اذكر الموقف بین یدي الله عز وجل !!**

خۆزگەم بەوانەی بە دڵ ـ نەك تەنها بە زار ـ لە خوا شەرم ئەکەن .. ترسی رۆژی قیامەت وا لە دڵیانا و خۆیان ئامادە ئەکەن تا سەرشۆڕ و شەرمەزار نەبن.. ئەوانە خواپێداون .. ژیر و سەلیقەدارن .. هەر ئەوانەش بە راستیی ژیانیان تەرخان ئەکەن بۆ خزمەت و چاکەکردن ..

## ( ٤ )

هەروەها ڕۆژگار تێپەڕی ئەکرد و قازیی خواناس خەریکی ئەنجامدانی کاری سەرشانی بوو •• بە فەرمانی خوا و بە پێی ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەری ئازیز ـ صلی اللـە علیه وسلم ـ دادگای موسڵمانانی ئەبرد بە ڕێوە •• باکی لـە کەس نەبوو •• بوونی بۆ هیچ ملهوڕێـك دا نەئەنا •• هەموو کەسێکی لە بەر دەم دادگادا بە چاوی یەکسانییەوە تەماشا ئەکرد •• بە پێی شەریعەت بڕیاری دەر ئەکرد و ملی بە کەس نەئەدا ••

بەم شێوەیە دەنگ و باسی داد و ڕاستیی‌ویستیی مامۆستای ڕاستگۆ بڵاو بوویەوە و کـەوتە بەر هـەموو گوێیـەك •• موسڵمانـان پشـوویەکیـان دا •• مافیـان نرایەوە مشـتیان •• هـەرچی بڕیارێـك مامۆسـتای چـاكویسـت دەری بکردایـە بـەوپـەڕی متمانـە و گوێڕایەڵییەوە وەریان ئەگرت ••

هەروا ژیانی ئەبردە سەر ، هەتا رۆژێکیان لە مزگەوتی کووفەدا وەك هەموو جارێ دانیشتبوو و خەریکی لێکۆڵینەوەی گیروگرفتی موسڵمانان بوو ، ئەوە بوو ئافرەتێك هاتە زوورەوە و بە دەنگی کزۆڵ و لاڵەوە وتی :

وا خۆم خستە پەنای خوا و پەنای تۆوە ئەی کۆمەك و پشتیوانی ستەملێکراوان !!

دیار بوو ئافرەتەکە یەکجار ناڕەحەت و گیرخواردە بوو •• بە تەواوەتیی ستەم زۆری بۆ هێنا بوو بۆیە وا ئەکرووزایەوە •• بێ ئەوەی حاڵی خۆی باس کات هاوار و نزای کۆمەکیی بوو !

مامۆستا راچڵەکی •• شەیتان کەلێنێکی دۆزیوەتەوە بۆ زیندووکردنەوەی داری زەقنەبووتی ستەم و ناڕەوایی پێویستە پێی بزانرێ و چارەی بۆ دا بنرێ •• بۆیە هەستایە سەر پێ و بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە هێزی دایە خۆی و پرسیی :

کێ ستەمی لێ کردوویت ؟

بەڵێ، بە لای حاکمی موسڵمانەوە سەیرە لە خاکی ئیسلامدا و لە سایەی حوکمی قورئاندا ستەم بکرێت ..

ئەی دادگای ئیسلامیی بۆ چیی دانراوە ؟

وەڵامی دایەوە : ئەمیری کووفە مووسای کوڕی عیسا ، مامۆی خەلیفە مەهدیی !!

ئەمیر بە خۆیا ئەنازێ و ستەم ئەکات ! خەلیفەی بەغداد برازایەتی ..

پرسیی : ئەی تۆ کێیت ؟!

وتی من ئافرەتێکم لـە نـەوەی جـەریری کوڕی عەبدوڵڵای هاوەڵی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللـه علیـه وسلم ـ .

پرسیی : ئەمیر چۆن ستەمێکی لێ کردوویت ؟

وتی : باغێکی دارخورمام بوو لە کەناری رووباری فوراتـا ، لـە باوکمەوە بۆم بـە جێ ما بوو ، لەگـەڵ براکانما بەشمان کرد و لـە نێوان بەشـەکەی خۆم و

ئەوانا دیوارم بۆ کرد •• وە پیاوێکیشم بۆ بـە کـرێ گرت هەتـا سەروکاریی باغەکە بکات و پێویستیەکانی جێ بە جێ بکات ، لـە ئاودێران و ئەمام ناشتن •• بـەم شێوەیە چەند ساڵێ تێپەڕیان کرد و منیش بە بێخـەم ژیانم ئەبردە سەر •• بەرهەمی باغەکە ئەهاتە دەستم و ئەمکردە خەرجی خۆم و منداڵـەکانم وە باغـەکەش چی پێویست بوایە بۆم جێ بەجێ ئەکـرد تا بوو بە باغێك لـە هی براکانم چاکتر و بەرهەم زیاتر ••

دوای ئەوە ئەمیر مووسای کوڕی عیسا بەشەباغی براکانمی کڕیی •• دڵیشی چووە سەر باغەکەی من و هەوڵی دا پێی بفرۆشم ، تەماعی خستە بەرم ، بەڵام من ملـم نەدا و پێم نەفرۆشت •• دوای تەماع و پارە کەوتە هەڕەشە و گوڕەشە و منیش هەر گوێم نەدایە و باکم لـە هەڕەشەکانی نەبوو •• وا ئەمشەو هەڵساوە پێنج‌صـەد کەس لـە پیاوەکانی خۆی ناردووە تـا بـە یـەکجـار دیوارەکەی نێوان هەڵ گرن ، بەمە باغەکەی من و هی دراوسێکەمیان تێکەڵ کردووە •• دارخورما و کشت و

کاڵەکەی خۆمم بۆ جیا ناکرێتەوە ..

ماموستا وتەکانی لـە ئافرەتـەکە وەر گرت ، جـا بـێ ئـەوەی هیچ بڕیارێـك دەر بکات ، فـەرمانی دا پارچە کاغەزێکی بۆ بێنن .. تیایا ئـەم نامەیەی بۆ ئەمیر نووسی :

بەڵام لـە دواییدا .. خوا تەمەنی ئەمیر درێژ کـا و رووی بکاتە چاکە و ڕێـگای ڕاسـت ، وە تـەواوی بەخششـەکانی خۆی بڕژێنێ بـە سـەریا .. ئافرەتێك هاتۆتـە لام و باسی بۆ کردووم کە فلانی کچی فلانە ، وە ئەمیر دوێنێ دەستی بـە سـەر باغەکەیا گرتووە .. جـا بـا ئەمیر هەر ئێستا خۆی ئـامادەی کۆڕی دادگـا بێت ، وە یـا جێگـری لـە جیاتـی خۆیـا بنێرێ ، والسلام !!

شەریك ئەیزانی ئەم کێشـەیە وا ئاسان نیـە .. بەڵام ئەم بە دەوری خۆی وەك موسڵمانێکی ڕەوشت‌بەرز پێویسـتە مافی ئەو ئافرەتـە وەر گرێتـەوە بۆی و لـە

هەمان کاتا ئەمیریش بێڕێز نەکا ٠٠ بۆیە زۆر بە نەرم و نیانیی نامەکەی بۆ نووسیی ٠٠ ئەوسا نامەکەی دایە دەست یەکێ لە پاسەوانەکان و پێی وت : ئەم نامەیەم بەرە بۆ ئەمیر مووسای کوڕی عیسا ٠٠

پاسەوان بەرەو کۆشکی ئەمیر کەوتە رێ و نامەی پێ گەیاند ٠٠ نامەی خوێندەوە ٠٠ بە دڵی نەبوو ٠٠ هەڵوێستی تێك چوو ٠٠ رەنگی گۆڕا ٠٠ ئەوە هات بە بیریا تازە کار لە کار ترازاوە ٠٠ ئافرەتە شکاتی کردووە و شەریکیش بۆ کەس کۆڵ نادا ! ٠ بۆیە بە پاسەوانی وت : جارێ لە پێشەوە بڕۆ سەرۆکی پۆلیسم بۆ بانگ کە ٠٠ بانگی کرد و هاتە بەردەمی ئەمیر و هەموو گیانی گوێ بوو بۆ بیستنی فەرمان و جێبەجێکردنی بە چاکترین شێوە ٠٠

ئەمیر پێی وت : هەر ئێستا بڕۆ بۆ لای شەریکی قازیی وە بە زمانی منەوە ( بە شێوەی گلەیی ) پێی بلێ : پاك و بێگەردیی بۆ خوا !! تا ئێستە کەسم نەدیوە وەك تۆ سەیر بێت !! ئافرەتێك هاتووە لات و

شکاتی لە من کردووە بێ ئەوەی راست کات ، چۆن شتی نەشیاو بەرامبەر ئەمیر ئەکەیت و کوێ لە ئافرەتێکی شێت ئەگریت بێ ئەوەی راست بێت ؟!

سەرۆکی پۆلیس چاك شەریك ئەناسێ •• چۆن تا ئەم ئامادە نەبێت شتی نەشیوی لە دژ دەر ئەکات ؟ بۆیە بە سەرسوڕمانەوە پرسیی :

جا ئایا قازیی مەحکەمەی کردووە تا بڕیاری بۆ دەرکا و دژی جەنابتان بجوولێتەوە ؟

ئەمیر وتی : نەء ، بەلام ئەوە بە شیاو ئەزانێ ئەمیر لە کۆڕی دادگادا لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بوەستێ !!

سەرۆکی پۆلیس تێ گەیشت ئەمیر فیزی رێگای نادا بچێ بۆ دادگا وە ئەیشی زانیی شەریك هەرچی بە راست زانیی نێر نیە کۆڵی پێ بدا ، ئەگەرچی ئەمیر و خەلیفەش بێ •• بۆیە ترسی لێ نیشت و لە ئەمیر پاڕایەوە و پێی وت :

خۆزگە ئەمیر ئەم پیاوەتیەی لە گەڵما بکردایە و لە گەیاندنی ئەو نامەیەی قازیی وازی لێ بهێنامایە ، بە

راستیی پیاوێکی رەق و نەبەزراوە و لەوانەیە هەرچی من پێم ناخۆش بێت ، پێم بکات ••

ئەمیر وتی :

تیا چیت برۆ ، بۆ ئەگونجێ کەسێ لە هیچ فەرمانێکم دەرچێ ؟!

سەرۆکی پۆلیس بە ناچاریی زووری ئەمیری بە جێ هێشت •• سەرگەردان و سەرسام •• نەی ئەزانی چی بکا •• وەك ئەڵێن بووبووە تەختەی سەر ئاو ••

ئایا نامەکەی ئەمیر بەرێت بۆ قازیی ؟ دیارە ئەوە لادانە لە راستیی و لایەنگیریی کردنی ئەمیرە لە سەر ناڕەوا و پێی تاوانبار ئەکرێت و قازیش بڕیاری دادپەروەرانەی خۆی دەر ئەکا بۆی و پیاویش نیە بتوانێ پەشیمانی کاتەوە •

یان لە فەرمانی ئەمیر یاخی ببێت ؟ خۆ دیارە ئەمیریش بە پایە و پلەی خۆیا و بەوەدا کە مامەی ئەمیری ئیمانداران ئەنازێ و دەست لە کەس ناپارێزێ ••

بیری کردوه هەرکامیان بکات ، یان قازیی وە یا ئەمیری لێ ئەڕەنجێ ..

هەر چۆن بێ رەنجاندنی قازیی ئاسانترە تا هی ئەمیر .. چونکە ئەمیر هەرچی هات بە سەریا ، ئەگەرچی بە ناڕەوایش بێت ، درێغیی ناکات ، چونکە خۆی چاك ئەزانێ لای داوە و ئەیەوێ فەرمانی بە زۆر بچەسپێنێ .. بەلام قازیی خواناسە و ، هەروەك خۆی بە راست ئەزانێ ، هەر بڕیارێکیش دەرکا لە سووری شەرع دەر ناچێ و ستەمی تیا نیە .. بۆیە بڕیاری دا کەوا نامە بەرێت و هەرچیش دێتە رێی بی گرێتە ئەستۆ .. ئەوسا فەرمانی دا بە سەر ئەوانەی لە گەڵیا بوون تا کەل و پەلی پێویست ، لە فەرش و لێفە و دۆشەك و نان و ئاو ، بەرن لەگەڵ خۆیانا بۆ بەندیخانە ، خۆیشی رۆیشت بۆ لای شەریك و بە ژیریی و نەرم و نیانیی نامەکەی ئەمیری پێ گەیاند ..

قازیی تێ گەیشت ئەمیر بێزی نەهاتووە بێتە دادگا و لەگەڵ ئافرەتێکدا بوەستێ ، وە سەرۆکی پۆلیسیشی

بەوە ئاوانبار کرد کەوا خـۆی حەزی کـردوە بێت و ئەمیر بپەڕێنێتەوە بۆیە پێی وت : من پاسەوانم بە شوێن ئـەمیـرا نـاردوە نـەك تۆ ، دیارە تۆیش لـە گەڵیـا رێك کەوتووی ئەگینا تۆ چیت داوە لەوە ؟!

خێرا بانگی کردە پاسەوانێك و فەرمانی بە سـەرا دا : دەستی ئەمە بگرە و بیخەرە بەندیخانەوە ..

سەرۆکی پولیس زۆر بە لایەوە ئاسایی بوو بخرێتە بەندیخانەوە چونکە ئەیزانی شـەرێك راسـت ئەکا و ئەبوایە ئەمیر خۆی بهاتـایە و ئامادەی دادگای ئیسـلام بوایـە ، بۆیە بـە زەردەخەنەوە رووی کـردە قازیی و پێی وت : بە خوا هاتبوو بە دڵما بەندم ئەکەیت ، منیش هەرچیم پێویسـتە لـە پێشـی خۆمـەوە ناردوومـە بۆ بەندیخانـە !

سەرۆکی پۆلیس دەرگای بەندیخانەی لـە سـەر دا خـرا .. بـە زووترین کات دەنـگ و باس بـڵاو بوویەوە و گەیشتەوە ئەمیر مووسـا .. تەواو پەسـت بوو .. پیشی خـواردەوە .. وەك مـار پێچی ئەدایـە

خۆی ، خێرا دەرگاوانەکەی ناردە لای قازیی تا بە زمانی ئەمیرەوە پێی را گەیەنێ :

نێرراوێك نامەیەکی گەیاندووە ، دوای ئەوەی ئەمیر فەرمانی بە سەرا داوە و ناچاری کردووە ، ئەبێ چ تاوانێکی هەبێ هەتا بەندی بکەی ، وە ئەشزانیی سەرۆکی پۆلیسی کووفەبە ؟!

دەرگاوانیش بەش بە حاڵی خۆی بەزداریی تاوانەکەی کرد .. نامەی ئەمیری گەیاندە قازیی ، هەر ئەوەندە بوو لێی حاڵیی بوو ، فەرمانی دا بە سەر پاسەواندا :

بی گەیەنە بە هاوەڵەکەی !

ئەویش خرایە بەندیخانەوە ..

دیسان دەنگ و باس گەیشتەوە ئەمیر .. هەواو نوورە بوو .. هۆشی لا نەما .. لە نوورەییا چاوی دەر بەرپیی بوو .. خەریك بوو بێئارامیی رووی تێ ئەکرد و بیری ئەکردەوە چۆن دەستێك بوەشێنێ ..

مانای بە چی ؟

شەریك چی ئەوێ ؟

ئەم ئەمیرە و ، مامەی خەلیفەیە و کەچی شەریك وەك پیاوێکی ئاسایی سەیری ئەکا و ئەیەوێ هەر بە زۆر رای کێشێتە دادگاوە ..

بۆچ دادگا بە دەستی بنەماڵەی دەست رۆیشتوو نیە ؟

کەی ئەگونجێ گەورەی ناوچەیەك ئاوا سووك سەیر بکرێ ؟!!

شەریکیش لە بەر خۆیەوە ئەمیری زۆر بە تاوانبار ئەزانیی :

گوایە دەوڵەتی ئیسلام ملکەچی شەریعەتی ئیسلام نیە ؟

پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە کاتی وەستانی لەشکری ئیسلامدا بەرامبەر لەشکری قورەیش لە بەدردا ، داردەستەکەی ئەدا بە دەست سوادەوە تا تۆڵەی خۆی لە پێغەمبەری خوا بکاتەوە و دارەکە

بداتــەوە لــە سکی ؟

ئیمامی عەلیی لەگەڵ جورلەکەیەکدا پێـکەوە لــە بەردەم دادگای شورەیحی قازیدا نەوەستان تا مەحکەمە بکرێن ؟

ئیتر ئەمیر خۆی بە چی ئەزانێ ؟

ئەمیر بیری کردەوە ئەگەر هەڵە بکا دەرهەق بــە شەریك خراپی لێ پەیدا ئەبێ ٠٠ بۆیــە ناچار بوو دان بگرێ بــە خۆیــا و بەرەو مزگــەوت کەوتــە رێ ٠٠ هەر چۆن بوو دڵی بــە مزگەوت ئەحەسایەوە تــا لــەم داوە رزگــاری بێت ٠٠ دوای نوێژی عەصــر چــاوی کەوت بــە ئیسحاقی کوڕی صەباحی ئەشعەثیی و چەند ناودارێکی کووفە کە هەموویان هاودەم و خۆشەویستی شەریك بوون و شکاتی ئەم کردەوەیــەی بە لایانــەوە کرد ٠٠ لە بەر خۆیەوە گلەیەکی زۆری پێ بوو بۆیە پێی وتن :

هــەمووتــان برۆن و ســەلامی پێ بگەیــەنن و ئێوەیش گلەیی لێ بکەن ؛ چونکە بــە راسیی گاڵتــەی

بـه خۆم و نێرراوانم کردوه •• ئینجا تێی گەیاندن ئەو هەرگیز خۆی بە هاوشانی ئـەو خەڵـکە رەش و رووتە نازانێ و رازیشی نیـە بەو چاوە سـەیر بکرێ • ئیتر چۆن ئـەبێ قازیی بـەو شـێوە سـووکـە لـە گەڵیـا بجووڵێتەوە ؟!

بـەڵێ ئەمیر بـە ناو ئیسلام دای ناوە ، بـەڵام لـە توێکڵی ئیسلامیش نەگەیشتووە •• وا ئەزانێ ئەبێ خزم و خوێش و دەست و پێوەنـدی خەلیفـە لـە خەڵـکی بەرزتر بن •• دیارە خۆشەویستیی دنیـا و تەماعـە وا مرۆڤ بێ ئاگا ئەکا و بەرەو تاوان رای ئەکێشێ ئەگینـا وە نـەبێ ئـەمیـر خـۆی وا دا نـا بـێ هـەڵگـری بیروباوەڕێکی تر بێ و وازی لـە ئیسلام هێنا بێ ••

پیاوماقووڵ و ناودارانی شـار بەرەو ئەو مزگەوتەی کە شەرێك نوێژی تیـا ئەکرد کەوتنە رێ •• لـە بەر خۆیانەوە بۆ کاری خەیر ئەڕۆن •• سەیر ئەکەن قازیی وا دوای نوێژی عەصر لـە مزگەوتـا ماوەتەوە •• دوای

تەواوبوونی کاری سەرشانی ئەو رۆژەی ، بۆ پشوودان و حەسانەوەی لاشەیی و روحیی پەنای بە مزگەوت بردوە •• تا دڵی لە سایەی مزگەوتا بحەسێتەوە و مێشکی پشوو بدات و لە بەر دەم پەروەردگارا پەیمانی راستیی و دادپەروەریی تازە بکاتەوە بۆ رۆژی داهاتوو ، وە تا بە ئەزم و نیازێکی سافەوە داوا بکا لە خوا لە داوی شەیتان بیپارێزێ و نەکەوێتە ستەم و ناڕەوایەوە ••

نێرراوانی ئەمیر لە شەریك چوونە پێشەوە، دوای سەلام و بە خێرهاتن ، باس هاتە ناو باسەوە و هەرچی ئەمیر پێی وتبوون ، بە گونجاو و نەگونجاویەوە ، هەموویان پێ گەیاند •• ئەمیش موسڵمان ئاسایی ، هەر چەندە خێرا لە مەبەستەکەیان گەیشت ، دەنگی نەکرد هەتا لە هەموو وتەیەکیان بوونەوە •• زۆر بە لایەوە سەیر بوو •• ئەم پیاوە ناودارانەش لایەنگیریی ئەمیر ئەکەن ؟

ئەمانیش تا ئەم رادەیە خۆیان گێل ئەکەن ؟

ئوایە ئەبێ کۆمەڵی موسڵمان ـ هەتا ناودار وسەر و سیماداره‌کانیشی ـ هەر هەمووی لایەنگیریی ستەمی ئەمیر بکا و پشتی داد و راستیی بەر بدا ؟

جا ئەوەی بیر کەوتەوە کە هەر کاتێ موسڵمانان بـە دەست کاربەدەستەکانیانەوە گیریان خوارد ، ئـەوە خۆیان شایانی ئەوەن .. شانیان هـەر ئـەوەندە هـەڵ ئەگرێ ..

بۆیـە بڕیاری دا ئەوانیش و هەموو موسـڵمانێك دەرسێ دا بدا کەوا هەر کۆمەڵێ نەیانوێرا دژی ستەم و ناڕەوا بوەستن ، وە بۆ دوو رۆژ ژیان خۆیان دا بـە دەستەوە تـا لافاوی ناڕەوا راینچیان کات ، ئـەوا خـوا سەرشۆڕ و زەلیلیان ئەکات با زۆریش بن .. وە هـەر کاتێ لـە سەر راستیی خۆیان مانەوە و سوور بوون لـە سەر بەرگریی موسڵمانانە خوا دەروویان لێ ئەکاتەوە... خۆ ئەگەر ئەم جیهانەیشیان لـە دەست دەر چێ ، ئـەوا قیامەتیان مسۆگەرە ، هەر چەندە هەرگیز موسڵمان دنیای

له دەست ددر ناچێ ، تەنها ئەوە نەبێ نایەوێ بە سووکیی بژی ..

قازیی تێ گەیشت بوو کۆمەڵ خۆیەتی وا بت بۆ خۆی ئەتاشێ و دوایش بـە دەستیەوە گیر ئەخـوا و ئەناڵێنێ ، وە هەر لێبڕانی چەند ئەندامێکی بە غیرەتی کۆمەڵیشه وا هـەموو بتێ ئەشکێنن و ئـالای ناڕەوا دا ئەگرنە خوارەوە .. وە هەر موسڵمانێکی بـە غیـرەت بەرگریی بکا لـە راستیی ئەگـەرچی بـەرگریـەکی بچووکیش بێت هێز و پێزێ ئەدا بە موسـڵمانان و بـە بەرەکانی دواوە تـا بەرەدت و جوامێریی زیاتر لە ناویانا ریشك دا کوتێ ..

جا بۆ تێ گەیاندنیان رووی تێ کردن و بـە وێنەی موسڵمانی چاونەترس پێی وتن :

چۆن رێگاتان بـە خۆتان دا بێن و لەو بارەوە قسە لـە گەڵما بکەن کە جگە لـە راستیی من هیچی ترم لـە دەست نایەت ؟ وە ئایا ئامادە بوون لـە کۆڕی مەحکەمەدا

بـه لای ئـەمیرەوە ئـەوەندە زەحمەتـە تـا بزانم ئـەو ئافرەتە بێدەستەڵاتە چ مافێکی هەیە و چیشی لە سەرە ؟ گوایـا دادگا تەنها بۆ چارە سەری گیروگرفتی هـەژار و ڕەش و ڕووت دانراوە ؟ بـە ڕاستیی لـە ترازووی داد و یەکسانیدا هیچ جیاوازییەك نیـە لـە نێوان چینی هەژاران و دەستەی ئەمیراندا ، چونکە لە ڕۆژی قیامەتا هەموو ستەملێکراوێك لـە بەردەمی خوای گـەورەدا بەرۆکم ئەگرێ و داوای مافی خۆی ئەکاتەوە لێم ، جـا چی بڵێم و کە پرسیارم لێ کرا بە چی وەڵام بدەمەوە ؟! خزمینە ویژداتتان هەبێ !!

دوای تەواوکردنی قسەکانی و سەرزەنشت کردنی نێرراوەکانی ئەمیر ، سەرنجی دا هێشتا ئەمیر ماویەتـی نەرم بێ و ملکەچ گا بۆ فەرمانی دادگای ئیسـلام .. چونکە ناردنی ئەمانە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی بـە تەمای ملەجەڕێیە و ئەیەوێ ئەوان بکاتـە پرد و بپەڕێتەوە .. ئینجا هاتنی ئەمانەش ، کە جێی متمانەی موسـڵمانانن ، ئەوپەڕی گێلیی و سادەییانە و ئەم جۆرانەش نەبن باوی

وەكو ئەمیر ئاوەها سەرگەردان و رەنجەڕۆ نابێ ..

بەڵێ نەرمیی ئەوانەی وان بە دەوروبەری كاربەدەستاندا و رازیی بوونیان لە كردەوەكانیان و رازیی‌كردنیان ، ئەبێتە مایەی دەستبڕینیان و رەنجەڕۆكردنیان .. جا پێویستە ئەوانە تەمێ بكرێن و تێ بگەیەنرێن كاری سەرشانی موسڵمان بەم جۆرە نابێت !

بۆ ئەمە فەرمانی دا بە سەر پاسەوانەكاندا و پێی وتن :

ئەمانە هەموویان بەرن بۆ بەندیخانە !! ئەمانە پشت‌گیر و ناوبژی‌كەری خراپە و تاوانن .. ئەمانە مایەی لە ئایین هەڵگێڕانەوەن !!

هەموویان بە جارێ واقیان وڕ ما .. شەریك چی ئەڵێت ؟ ئەمان كەی بە تەمای قسە و بڕیاری وا بوون ؟ شەریكیان بەو شێوە نەناسیوە وبیریان لێ نەكردۆتەوە !

بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە هەموو بە یەك دەنگ وتیان : ئەوە بە راستتە ئەی شەریك !!؟

وتی : بەڵێ ، هەتا جارێکی تر نەکەن کۆمەکیی و پشت گیریی هیچ ستەمکارێ بکەن !

ئەگەر ماوە نەدرایە لـە سەر ستەمی جارێك ، ئیتر ستەم دووبارە نەئەبوویەوە •• بەخشین و چاوپۆشیی و خاترانە کۆمەڵ ئەڕووخێنێ ، بۆیە موسلمانە شارەزاکان ئـەمـەیـان چاك لـە یاد بوو و لادانیـان لـە نزیـك و دۆستەکانیان زیاتر ئەگرت تـا فێری چاوپۆشیی نەبن ••

فـەرمان ـە قـازیی دڵسـۆز و دادپەروەرەوە دەرچوو و پاسەوانەکانیش بە دڵ و بە گیان جێ بەجێیان کرد • بـە دڵ فەرمانی شەریکیان جێ بەجێ ئەکرد •• هەموو فەرمانێکی •• چونکە بـە ترازووی شـەریعەتی پـاك و بێ گەرد بوون ••

سەرۆکی پۆلیس و دەرگاوانی ئـەمیر دەوریـان قەڵەبالغ بوو •• شەریك کۆمەڵێکی لـە بەندیخانە کـۆ کردەوە کـە هەرگیز ئەوانە نە خۆیان و نە هیچ کەس بـە تەما نەبوون هەموویان وا پێکەوە توندی بەندیخانـە بکرێن ••

لەو کاتەدا کە شەرێك لە مزگەوتا بوو و نوێنەرانی ئەمیر هاتن بۆ لای خەڵکێکی زۆر لـە دانیشتوانی کووفە جەمیان خواردبوو تا بزانن هەڵوێستی مامۆستای خواناس بـە کوێ ئەدا و ئەنجامی زۆرانبازیی دنیـا و قیـامەت چی بـە سەر دێ ..

جـا کاتێ هـەڵوێستی مەردانـە و پاڵـەوانانـە و دادپەروەرانەی مامۆستایان بینی کە هەتـا ئـەو هـەموو ناودارانە نەیان توانی ساردی کەنەوە ، بەڵکو لۆمەیشی کردن و دوای ئەوەیش توندی بەندیخانەی کـردن ، هـەنـدێـکیـان دەنـگیـان بـە « اللـه اکبـر » بـەرز کـــردەوە !! وە هـــەنـدێکـی تریشیان بـە پەلە خۆی لەو ناوە دوور خستەوە نەوەکو بێت بـە سەری قازیدا و فەرمان بدا هەرچی وا لەوێ ئامادەیە وەك نوێنەرەکان تاوانبارە و بۆ کۆمـەکیی و یارمەتیی ئەمیر هاتووە !

ئەمپەڕ و ئەوپەڕی شـار ئاگاداری دەنگ و باس بوو .. قازیی و ئەمیر ، قیامەت و دنیا زۆرانبازیانە ..

بوو بە گفت و گۆ و دەمە دەمێ •• هەر کۆمەڵێك بـە جۆرێ بیریان ئـەکردەوە و لایـەنگیریی لایـەکیان ئەکرد ••

دەسـتەیەك ، کـە زۆربەی دانیشـتوان بوون ، لایەنگیریی مامۆستای خواناسیان ئەکرد و بـەو کارەی زۆر رازیی بوون ، وە پێیان وا بوو ئەگەر کاربەدەستی خواناس چاوپۆشیی لـە لادان و ترازان و ملهوڕیـی نەکات هەرگیز خراپە و تاوان لە ناو کۆمەڵا پەرە ناسێنێ •• کەچی هەندێکی تر لـە مامۆستا دڵگـران بوون و ناڕازیی بوون ئەو پیاوانە بخرێنە بەندیخانەوە و بە توند و تیژیی تاوانباریان ئەکرد ••

ئێوارە هات و بەندیەکان لـە بەندیخانە مانەوە •• ئەو باسە بووە بنێشتە خۆشەی ژێر هەموو ددانێك •• هەموو کۆڕێك هەر ئەو باسەی بـە سەر دەمەوە بوو•• هەر یەکەیش بە پێی بیری خۆی لێکی ئەدایەوە ••

هـەندێ بەوبـەڕی دادپـەروەریـان ئـەزانیی و هەندێکیش ناڕازیی بوون ••

هەرچۆن بێ شار پەشۆکاوە و کەس ئاگای لە دەنگ و باسی تازەی ئەو شەوە نیە •• هەموو کەسێ بەش بە حالی خۆی دلی دامەزراو بوو جگە لە ئەمیر مووسا •• ئەو شەوەی لێ نەئەرۆیشت •• چەندە دەستە و دایەرەکەی دلخۆشیان بکردایە ، دالغەی لە مێشکی دەر نەئەچوو و وای ئەزانیی شەرێك گاڵتەی پێ کردووە و هەموو جیهانیش پێی پێ ئەکەنێ •• شەیتان چووە بن کلێشی تا زیاتر لە سەر تاوان و یاخیبوون بڕوا ، وە تا هەلوێستی لاری بە تەواوەتیی دەر کەوێ •• بۆیە هەر ئەو شەوە خۆی پێ نەگیرا و هەلسا لەگەل چەند سەربازێکی سوارچاکدا بەرەو بەندیخانە کەوتە رێ و بە هەڕەشە و لێدان و دەستدرێژیی کلیلی دەرگاکانیان لە پاسەوانەکان سەند و بە زۆر دەرگای بەندیخانەیان کردەوە و هەرچی دوێنێ شەرێك ناردبوونی بۆ بەندیخانە هەر هەمووی بەردان !!

ئەمیر دەستی خۆی وەشاند و وای ئەزانی باری لاری بەوە راست ئەبێتەوە •• وای ئەزانی دوێنێ

شەربك شكاندوویەتی و ئەبێ بەم شێوەیە هێز و سامی خۆی بنوێنێ و لە بەر چاوی دانیشتوان خۆی قورس کاتەوە ..

کەچی بە پێچەوانەوە، کە رۆژ بوویەوە و خەڵکیی دەنگ و باسەکەیان کەوتە گوێ بە جاڕێ رفیان لە ئەمیر هەڵسا ، چونکە بەندیخانە جێی تەمێ کردنە .. دەی کەواتە پاراستنی پێویستە ، نەك لە بەر خۆی بەڵکو لە بەر ئەو مەبەستەی کە بۆی دانراوە ، کە بریتییە لە پارێزگاریی مافی موسڵمانان ، جا چۆن ئەبێ هیچ موسڵمانێ بیر لەوە بکاتەوە دەستدرێژیی بکاتە سەر ، چ جای ئەمیری شار !؟

بەندیخانە لە ئیسلامدا یەکێکە لە هۆکانی بەدیهێنانی یاسا و داد و بۆ سەندنەوەی تۆڵە لە سەرکەشان بە کار ئەهێنرێ ، تا سەرکەشیی پەرە نەسێنێ و گەشە نەکات ، کەی بۆ ئەمیر ئەشیاوە ، جەردە ئاسایی ، هێرشی بکاتە سەر ؟

کە ئەمیر ئاوا مل پێچیی بکا لە بڕیارەکانی

شەریعەت ، بـە تایبەتیی ئەگەر ئەو بڕیارانە لـە دەمی پیاوێکی وەك شەریکەوە دەرچن ، ئەبێ خەڵکیی چـۆن هـار نەبێت و لـە دەوڵەت هەڵ نەگەڕێنەوە ؟ ئیتر ئەوە بوو زوربەی ئەوانەی دوێنێ لۆمەی قازیان ئەکرد لـە سەر بڕیارەکانی ، کە ڕەفتی ئەمیریان بینیی ، بە جارێکا پشتیان لـە ئەمیر هەڵ کرد و بوونە پاڵپشتی قازیی ..

دەنگ‌وباس گەرم‌تر بوو.. خەڵکیی بە پەرۆشەوە سەرنجی کارەساتی ئەدا ، تا بزانێ ئەنجامی زۆران‌بازیی بـە کوێ ئەگا ؟

مامۆستای خواناس کە ڕۆژ بوەوە ، خۆی ئامادەیی لـە ژووری دادگادا دانیشت تـا بـە ئـەرکی پیرۆزی هەڵسێ .. سەیری کرد وا کلیلەوانی بەندیخانە هاتـە ژوورەوە و هەواڵی ئەوشەوەی بە درێژە دایێ ..

شەریك بیری کردەوە ئەمیر زۆر منداڵە و کارەکانی هەمووبان منداڵانەن .. جا یا ئەبێ دەرسێکی وەهـای دا بدا لە بەر چاو دانیشتوانی کووفەدا مل کەچ کا بۆ هەر بڕیارێکی شەرعیی کە دادگای ئیسلام دەری ئەکا ، وە یا

ئەو خۆی لـە « قضاء » رزگار بکا و تاوانی هەزارانـی نەیەتە گەردن ..

یـان ئەبێ فەرمانی شەریعەت بڕوا بە رێوە ، وە یـا ئەو وازی لێ بهێنێ و لـە ماڵی خۆیـا دانیشێت .. دوای بیرکردنەوە و لێك‌دانەوە بانگی کردە دەرگاوانی دادگا و فەرمانی بە سەرا دا کیسی کتێبەکانی بۆ ئامادە بکا .. هەموویانی پێچایەوە و ئەوسا ناردنیەوە بۆ ماڵەوە ، تـا بـە یەکجاریی دەسـت لـە دادگـا هـەڵ گـرێ و پەیوەندیی پێوەی نەمێنێ ..

ئینجا بـە خزمەتگوزارەکەی وت : چی کەل و پەلم هەیە هەمووی کۆ کەرەوە و بەرەو بەغدا با بکەوینە رێ .. بـە خوا من داوام نەکردوە نـەوەی عەبـاس کاروباری دادگام پێ بسپێرن ، بەڵکو ئەوان منیان ناچار کردوە پێی هەڵسم ، بەو مەرجەی بەڵێنیان داوە ، بەڵێنێکی چاك ، تا کەسێ نەتوانێ دەست بخاتـە کارمانـەوە ، وە چوونە ژێر ئەوەی سەربەست بین لەو کارەدا کە پێمان

ئەسپێرن • بەڵام ئێستا کە ئاوەهایان کرد ئیتر ئێمەیش رزگارمان بووە بە دەستیەوە !

بەرەو پردی کووفە و بە نیازی شاری بەغداوە لە ماڵ دەر چوو ، بەڵام نەك بە تەنیا •• بەڵکو خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی کووفە بە شوێنیەوە بوون و پیرۆزبایی سەرکەوتنی راستیی و دادپەروەرییان ئەکرد بە سەر ناڕەوایی و ستەمدا •• کەوتبوونە گەڵ مامۆستای خواناس ، دڵسۆز ، راستگۆ ، تا گەرمترین خواحافیزیی لێ بکەن •• تا بیسەلمێنن مامۆستای پێشەوایان ئەگەرچی شارەکەیان بە جێ بێڵێ ، هەتا هەتایە لە قووڵایی دڵیانا خۆشیان ئەوێ و هەر ئەو ماوەیە بە تەمەن ئەزانن ئەوی بەرێز لە دادگای شارەکەیاندا کاربەدەست بوو •• بە پێچەوانەی ئەو دز و جەردانەوە کە بۆ یەکەم جار بە دزە خۆیان ئەکەن بەو شارەدا کە ئەبنە کاربەدەستی تا کەس نەزانێ چەند بە رەش و رووتیی و رەجاڵیی کاریان گرتۆتە دەست ، وە کاتێکیش ـ دوای زوڵم و ستەم و ناڕەوایی

و رووتاندنەوەیەکی بێ ئەندازە ــ کە شار بە جێ دێڵن ، هەر بە دزە بار ئەکەن تا خەڵک نەزانێ تا چ ئەندازەیەك خوێنی رەش و رووتیان مژیوە ..

هەر ئەوەندە بوو لە دەرگای مزگەوت هاتە دەرەوە ، تا شار بە جێ بێڵێ ، خێرا کاسەلێسان بە پەلە هەواڵی پڕمەترسیان دا بە ئەمیر ..

هەواڵ درایە ئەمیر تا فریا کەوێ تەگبیرێ بکا .. قازیی هەنگاوی گەورەتری وا بە دەستەوە .. نەوەکو دەمی بکاتە خەنیفە .. جار لە دوای جار و هەنگاو لە دوای هەنگاو زیاتر خەڵکیی پشتگیریی هەنگاوەکانی ئەکەن ..

ئەمیر راچڵەکیی .. رەنگی هەڵ بزرکا .. لەرزی لێ هات .. چۆن تەگبیر بکا ؟ هەر تەگبیرێ ئەکا ، قازیی چاکتر رێگای لێ ئەگرێ و زیاتر خەڵکیی لێ دوور ئەخاتەوە ..

کەڵك ناخوا دژایەتیی .. ئەبێ فریا کەوێ ، ئاشتی

کاتەوە ‥ شوان هەتا دانیشێ ، رانی دوور ئەکەوێتەوە ‥ ئەو ئەمیرەی کە بێزی نەئەهات بێتە دادگای ئیسلام مل کەچ کا بۆ فەرمانی شەریعەت ، ناچار بوو لەگەڵ چەند سوارچاك و خزمەتگوزارێکیا سوار بن و بە پەلە خۆیان بکەیەننە لای شەریك ‥ ئینجا بە لاڵە و پاڕانەوە دەستی دایە گوفتار :

ئەی قازیی بەڕێز ـ خوا بت خاتە سەر ڕێگای چاکەویستیی ـ پەلە مەکە و ورد بەرەوە و کەمێ ئارامت هەبێ ‥ سەرنج بدە ، ئایا دوای بەندکردنی دیرراوەکانم ، ئەتەوێ پیوماقوول و ناودارانی شارەکەش بەند کەیت ؟!

وەکو بڵێت : ئاخر ئەوان تاوانیان چیە ؟ هەموو مەبەستێکیان ڕێك کەوتنمانە و هیچی تر !

وەڵامی دایەوە : بەڵێ ، چونکە بە دوای کارێکا رۆیشتوون ، نەئەگونجا بە دوایا بڕۆن ‥

ئەمیر وتی : ئاخر ئەوان تاوانیان نیە ، چونکە من رووگیرم کردوون و هاتوونەتە خزمەتت !

قــازیی داخ لــە دڵیـا بوو بۆ کاربەدەستی حاکی ئیسلام ، کەوا بە دڵ و بە گیان ملکــەچی شــەریعەت نەبێ و لــە ژیانیا خۆی پێــوە خەریك نەکات .. بۆیــە رووی کردە ئەمیر و وتی :

ئەی گوایـا تۆ نازانی بــە لای منەوە ، لــە کۆڕی دادگادا ، جیاوازیی نیــە لــە نێوان ئەمیرێکی گــەورە و ئافرەتێکی بێدەسەڵاتی ستەملێکراودا ؟

ئــەمیر لــە جێی خــۆیـا وشـــك بوو بوو .. نەیئەزانی چــۆن خۆی دەرباز کـا .. نــەیئــەزانی ئــەمجارە شەریك چ رێگایەکی تری لێ ئــەبڕێتــەوە ، بۆیــە پرسیی :

ئەی ئێســتە چیت ئەوێ مامۆسـتا و ســـەرداری قــازیــان ؟

وەلامی دایەوە : بڕیارم داوە خۆم بگەیەنمە بەغدا و بچمە لای خەلیفە مەهدیی و داوای لــێ بکــەم نــە هــەڵسووڕاندنی کاروبــاری دادگای کووفــە ، بەڵکو

هەموو دادگایەك ، دەستبەردارم بێ و رز کارم بکا لێی ..

مامۆستای موسلمان ، ئەوەندە بە تەنگ پایە و پلە و مووچەی دنیاوە نەبوو .. بەڵکو راستیی ئەویست .. دادی ئەویست ، بۆیە بە سەری بەرز ز رووی سپیەوە ژیانی نەبردە سەر ..

لەولاوە ئەمیرەن چونکە مەبەستی ژیانی دنیا و رابواردن و حەسانەوە بوو کەوتە مەترسیی و بیری لە ئەنجامی ناهەمواری کارەکەی ئەکردەوە ، چونکە دڵرەنجاندنی شەریك ، چ بە لای خەلیفەوە و چ بە لای موسڵمانەکانەوە شتێکی گەورە بوو ، لە بەر ئەوە کەوتە ماساوکردن بۆ قازیی و بە قسەی شیرین هەوڵی دا رازیی بکا .. بۆیە پێی وت :

ئەی ئیتر چارەیەکی ترت بە لاوە نیە ؟ خۆ ئێمە وا تۆمان ناسیوە هەمیشە گرێکوێرەی گیروگرفت کردۆتەوە !!

مامۆستا لە سەر بیانوو نەبوو .. دادی ئەویست

•• ئـەی ویست دەسـتی بڕوا مافی هـەموو کـەسێ پارێزگاریی بکات •• ئەی شەریعەت بۆ پاراستنی مـاف نەبێت ، وە بۆ چەسپاندنی پایەی راستیی نەبێت بۆ چیی ترە ؟ بۆیە کە زانیی ئەمیر لـە ملەجەڕێ کـەوتووە بۆ ئامادەی رێکەوتنە ، ئەمیش هاتـە سەر رێکـەوتن و وتـی :

کەواتـە هەرچی فـەرمانم داوە بە بەندکـردنـی ئەچێتەوە بەندیخانە ••

ئەمیر باری سەرشانی سـووك بوو •• ئۆخەی ئەمە قازییە وا ئامادەی رێکەوتنە تـا خەلیفە نەی‌زانیوە، وە تا دانیشتوانی شار و دێهاتانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی **خاکی ئیسلام نەیان بیستووە ؟**

وتی : هەر هەموویان ئەگێڕمەوە بەندیخانـە وەك چۆن دەرم هێناون ••

شەریك وتی : دە بە خوا لەم شوێنەما ناجوولێم ـ واتە ناگەڕێمەوە ـ هەتا نەیان گێڕیتەوە ••

ئەمیر بـە خۆی و دام و دەزگا و پیاوانـی دەور و بەریەوە بە پەلە و بە ناچاریی و بە فیز و دەمارێـکی تێك شکاوەوە گەڕایەوە شار و بەندیەکانی کۆ کردەوە و توندی بەندیخانەی کردن ، ئینجا کلیلی بەندیخانەی دایەوە دەست کلیلەوان و ئەویش بە پەلە خۆی گەیاندە لای شەریك و هەواڵەکەی دایێ ، ئـەمیریش دوا بـە دوای ئەو هاتەوە و بە قازیی وت :

هەموویانم گێڕایـەوە ، دە تۆیش بگـەڕێـرەوە دادگـا ..

شەریك بۆی دەرکەوت ئەمیر بە راستیەتی و نـە بەردەم فەرمانی شـەریعەتدا ملبادانی نەماوە ، بۆیـە رەزامەندیی نواند و فەرمانی دا بـە سەر کلیلـەوانـی بەندیخانەدا تـا جڵەوی وڵاغەکەی ئەمیر بگرێ و بەرەو کۆڕی دادگا بکەونە رێ ..

شەریك گەڕایەوە ناو شـار .. چووەوە دادگا و لـە سەر کورسیی داد و یەکسانیی دانیشت .. سوپاسی خوای کرد لە سەر سەرکەوتنی ئیمان و راستیی بە سەر

هەوا و ئارەزووودا ، سوپاسی خوای کرد وا هیدایەتی ئەمیری دا تا بگەڕێتەوە بۆ ژێر سێبەری شەریعەت ..
سوپاسی خوای کرد وا دڵ و دەروونێکی دامەزراوی پێ بەخشیی تا بۆ هیچ رەشەبایەك مل نەدات ..

ئینجا فەرمانی دا ئافرەتە ستەم لێکراوەکەی بۆ بانگ کەن .. هاتە ژوورەوە و پێی وت : ئەمە بەرامبەرەکەتە وا ئامادەیە ..

کۆڕی دادگا بوونی داد و راستیی ئەدا .. ئەمیر لەگەڵ ئافرەتی بێدەسەڵاتدا لە دادگا بەرامبەر بوونەوە .. پێش دەستپێکردنی مەحکەمە ئەمیر داوای کرد لە شەریك، لە بەر ئەوەی ئامادەی دادگا بووە و لە ملپێچی کۆڵی داوە ، با بەندیەکان ئازاد بکرێن .. قازیش بە چاوان بە گوێی کرد و فەرمانی دا هەموو بان لە بەندیخانە بچنە دەرەوە ..

دادگا بە ناوی خواوە دەستی پێ کرد .. دادگای شەریعەتی ئیسلام ئەوەی پێویست بوو بۆ روونکردنەوەی راستیی گرتیە بەر :

پرسیار کرا لە ئەمیر لە باردی داواکانی ئافرەتەکەوە ، ئەویش ددانی نا بە راستیی داواکانیا ..

کە ئەمیر خۆی ئەمەی دەر خست ، قازیی فەرمانی دا : کەواتە هەموو ئەوەی لێی سەنراوە بۆی ئەگێڕیتەوە و وەك چۆن بە خێرایی دیوارەکەت رووخاندووە وەهاش ، بە خێرایی ، بۆی دروست ئەکەیتەوە ..

ئەمیر رەزامەندیی خۆی بۆ وتەکانی شەریك بە چاوان دەربڕیی . قازیش ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئافرەتەکە و پرسیی : ئایا هیچی ترت ماوە ؟

واتە : داوای ترت هەیە تا باسی بکەین ؟

وتی : نەء ، خوا پاداشتت بە چاکە بداتەوە و پیرۆزیش بخاتە حوکمە پڕ لە داد پەروەرییەکەتەوە !!

بەم شێوەیە کۆتایی هات بە کۆڕەکە و ئافرەتیش بە دڵی شادمان و سەری بەرزەوە چووە دەردوە و هەموو ئەندامێکی سوپاسی خوای پەروەردگاری ئەکرد وا شەریعەتی پاك و بێ گەردی ناردووە کەوا ئەم مامۆستا موسڵمانە لەخواترسەی پەروەردە کردوە .

دوای ئەمەی کە شەریك دڵی حەسایەوە بە گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکەی وای بە چاك زانی دڵی شکستی ئەمیر بێنێتەوە جێ ؛ بۆی بسەلمێنێ کە هیچ رقێکی لێی نیە ، چونکە ئەویش لەوە زیاتر بەرگە ناگرێ و لە بەر ئەوەی ملی داوە بە شەریعەت وا چاکە دڵ نەوایی بکرێ ـ بەڵکو شایستەی رێز لێ گرتنیشە ـ تا شەیتان دڵی لە خشمە نەبا ، بۆیە هەڵسابە سەر پێ و دەستی ئەمیری گرت و بە زۆر لە جێگای خۆیا دای نا ..

خواناس دڵی نابێ گەردی تیا بێ .. نا بێ فیز و خۆهەڵکێشانی هەبێ .. نابێ بهێڵێ دڵی کەس گەرد بگرێ ، بۆیە دوای ئەوەی ئەمیری لە جێگای خۆیا دانا سەلامێکی گەرمی لێ کرد و پرسیی : ئایا فەرمانێکت هەیە ؟!

ئەمیر بە گاڵتەوە وتی : جا چ فەرمانێکم هەبێ دوای ئەوەی کە رووی دا ؟

هەموویان بــە جارێکا دەستیان کردە پێ کەنین ..

کاتێ کە بیرم لــە پێ کەنینی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە دەستڕۆیشتووە و وێنەی لــە سەرانســەری جیهــانی ئیســلامیدا ، لــە هەموو چــەرخە ئیســـلامیەکاندا ، ئەکردەوە ، ئەمویست لەو خۆشیی و بەختیاریەی ئەوان خۆم بەشدار کەم ، خێرا مووچڕکێك هات بە لاشەما ، دڵــم پڕ بوو .. ساردیی و خەمباریــەك دڵمی داگیر کرد و هات بە دڵما :

ئێمەی موسڵمانی سەرگەردانی ئەم چەرخە هەتیو کەوتووین ، هەتیو کەوتوو .. ئەو خۆشیی و پێ کەنینە بــە ئێمە چی ؟ ئەو رۆژە موسڵمان سەرداری سەرزەویی بوو ، ئاوەدانی ئەکردەوە .. دادی تیــا بڵاو ئەکردەوە .. ئادەمیزادی ئەحەساندەوە .. خــەم و خەفەتی لــە دڵەکان ئەڕەواندەوە .. بەڵام ئێستا .. ئێستا پێچەوانەیە .. خۆشیی و پێ کەنین لای خوانەناسانە .. خــەریکی پلانی شەیتانیین بۆ قڕپێ کردنی ئادەمیزاد !!

ئەمویست بەشداریی پێ‌کەنینەکەیان بکەم بەلام خێرا ئەزووی خەم و خەفەت بە لەشما ئەهات !

ئەمە نموونەی ژیانی شەریك بوو •• بەم شێوەیە ژیانی لە دادگا ئەبردە سەر •• راستیی ئەویست •• دادی بلاو ئەکردەوە ••

لەو شوێنەی خۆیا مایەوە هەتا سەردەمی خەلیفە هاروونورڕەشید ، لەو کاتەشدا والیی کووفە مووسای کوڕی عەلیی بوو •• زۆر دژایەتیی لەگەڵ شەریکا ئەکرد •• ئەمیش خۆی ئاسایی دامەزراو و کۆڵنەدەر بوو •• تا ئەوە بوو دەنگ و باس بلاو بوویەوە کەوا خەلیفە خۆی بەرەو کووفە کەوتۆتە رێ تا شەریك لە هەڵسووڕاندنی کاروباری دادگا بخات ، والیی کە ئەمەی بیست زۆری پێ خۆش بوو ، خێرا هاتە لای شەریك تا هەواڵەکەی بداتێ •• بۆیە پێی وت :

ئەوەی ئەمیری ئیمانداران بە تۆی کردووە تا ئێستا بە کەسی نەکردووە !! لە هەڵسووڕاندنی کاروباری دادگای خستووی ••

شەریك تێ گەیشت مەبەستی والیی چیە .. والیی داماو بوو ، وای ئەزانی شەریك بەوە خەمبار ئەبێ و دەست ئەکا بە خراپەوتنی خەلیفە .. بەڵام شەریك - رەحمەتی خوای لێ بێ - موسڵمان ئاسایی رەوشتی بەرزی خۆی لە بیر نەئەچووەوە کە یەکەم : موسڵمان ئەوەندە دڵی بە پایەی دنیا خۆش نیە و هەڵپەی بۆ ناکا . دووەم : هەرکەسێ نیازێکی خراپی دەرهەق بکا ، خێرا رقی لێ هەڵ ناگرێ و دەست ناداتە خراپەوتن بەرامبەری . وە سێیەم : موسڵمان لە کاتی ناسکدا ئیمانداریی خۆی ئەسەلمێنێ و پیشانی خەڵکیشی ئەدا .. بۆیە بە جوانیی والیی تێ گەیاند و وتی :

ئەوان ئەمیری ئیماندارانن بۆیان هەیە قازییەکان لە کار بخەن و کاربەدەستان لە سەر کاری خۆیان لابەن ، ئەوەیش بە شوورەیی دا نانرێ بۆیان !!

مووسای والیی هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە لە باسیا وتی :

نەهاتووە بە بیرما تـا ئەو رادەیەش شێت بێت !!
هەرچی قسەیەکی بۆ بکەیت ئەو باکی نیـە !!

بەڵێ لە ترازووی تێ نەگەیشتوانا هەڵوێستی بەرز شێتیە .. هەڵپەنەکردن و خەم و پەژارە نەخواردن بـە شوێن دنیـادا بـە سـادەیی و گێلیی ئەزانن .. بـەڵام موسڵمان ترازووی تایبەتی خۆی هەیە ..

بەم شێوەیە شەریك بەوپەڕی سەربەرزیەوە لەو تاقیکردنەوە گەورەیە رزگاری بوو .. چەند بە پاکیی دەستی دایێ ، وەهاش بە پاکیی دەستی لێ هەڵ گـرت ، بێ ئەوەی دڵی موسڵمانێك بڕەنجێنێ ، بە دەستقەست مافی کەسێك بە کەسێك بدات .. لایەنگیریی دەسەڵاتی رۆزگار بکات ..

بە فەرمانی خوا ژیـا ، بـەڵام ژیـانێکی مەردی موسڵمانانە ، بێ ئەوەی هیچ هێزێك بتوانێ لـە خشتەی بەرێ و لـە بیر و هەستە ئیسلامیە گەرمە بێگەردەکەی لای بێ بدات .. تـا ئـەوە بوو لـە رۆژی شـەممەی

یەکەم رۆژی ذولقـەعیدەی ساڵی صەد و حەفتا و حەوتی کۆچیی ، بەرامبەر بـە ساڵی حەوت‌صـەد و نـەوەد و چواری لەدایك‌بوون و لە تەمەنی هەشتا و دوو سـاڵیدا بـە سەری بەرز و رووەمەتی گەشاوەوە ئەم جیهانەی بە جێ هێشت •

کاتێ رەشید ئەمیری ئیمانداران مەرگی شەریکی بیست ، لەو کاتەدا لـە حیرە بوو ، ویستی بچێت بۆ کووفە تـا نوێژی لـە سەر بکا ، بـەڵام بۆی رێـك نەکەوت •• ئەوە بوو والیی ئەو کاتەی کووفە مووسای کوڕی عیسا بوو ، کەوتە شوێن تەرمەکەی و نوێژیشی لـە سەر کرد ••

بەڵێ شەریکی قازیی ، مامۆستای خواناس ، قوتابیی راستەقینەی قورئان ، نموونەی کاربەدەستی موسـڵمان بوو •• کۆمەك و پشتیوان بوو بۆ هەژار و بێ‌نەوایان •• ماف‌سێنی ماف‌خوراوان بوو •• هەموو ژیانی بریتیی بوو لـە هەوڵ و کۆششێکی بێ‌وچان تـا شەریعەتی خـوا

دەوری تەواوی خۆی ببینێ و بەری شیرینی پێشکەش بــە ئادەمییەکان بکات ، بە تایبەتیی ئەو کاتانەی کە قازیی بوو ••

لــە کۆتاییدا لــە خوای گەورە ئەپاڕێینەوە رەحم بکا بــە شەریك ، وە بە یەکێ لەو قازیانە بیداتە قەڵــەم کە راستیی شارەزان و بە پێی ئەو ناکۆکیی نێوان خەڵکیی چارەسەر ئەکەن و لە ئەنجامیشا بە بەهەشتی بەرین شاد ئــەبن ••

هەروەها ئەپاڕێینەوە رەحم بــە ئێمــەیش بکات و شوێن پێی ئەو مەردانە هــەڵ گرین ، تــا ســەربەرزی هەردوو جیهان بین ••

ئــامین ••

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين •

## سەرچاوەکان


| پەڕاو | نووسەر |
|---|---|
| ١ ـ فقه السنة / المجلد/٣ | السيد سابق • |
| ٢ ـ صفة الصفوة / المجلد/٣ | ابن الجوزي • |
| ٣ ـ تأريخ الخلفاء | السيوطي • |
| ٤ ـ مجلة التربية الاسلامية / ع٦ س٢٦ | |
| ٥ ـ مجلة التربية الاسلامية / ع٧ س٢٦ | |
| ٦ ـ مجلة التربية الاسلامية / ع٣ س١٢ | |


---


رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ٢٣٥ لسنة ١٩٨٦

# له دادگای ئیسلامدا

● گەشتێکی کورتە بە مێژووی ئیسلامدا تا نموونەیەکی گەشەدارمان بەرچاو کەوێ لە رەفتی بەرزو پیرۆزی موسڵمانی خواناس ، و لە یادمان بێت هەر تەنها ئیسلامە وا هەزاران بەڵکو ملیۆنەها پیاوچاکی هەڵ خستووە بۆ خزمەتی راستیی و حەسانەوە و ئاسوودەیی ئادەمیەکان ..

● دەستنیشانە بۆ هەوڵ و کۆششی خوانسان لە پێناوی راستیی و دادپەروەریدا ، تا تەمی زوڵم و ستەم برەوێتەوە ..

نرخی (٣٥٠) فلسە

مطبعة الارشاد ـ بغداد ـ شارع المتنبي ـ هاتف ٤١٦٧٦١٧